**پێشەکی / مانای باج:**

**لە لێکۆڵینەوە داراییەکان زۆر بە باج دەدرێت، لەبەر ئەوەی بە سەرچاوەیەکی گرنگی داهات بۆ دەوڵەت دادەنرێت، ئەم گرنگی پێدانە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ گەورەی قەبارە وهێندەکەی بەڵکوو بۆ کاریگەریەکەی لەبواری سیاسی وکۆمەڵەیەتی و ئابوری دەگەڕێتەوە، کەیەکێکە لەهۆکارەکانی سیاسەتی دارایی و دەوڵەت بەهۆیەوە کار لە چالاکی ئابوری دەکات لە پێناو دەستەبەرکردنی ئامانجی ئابوری و کۆمەلآیەتیەکانی، چونکە لە لێکۆڵینەوە داراییەکان جێگایەکی زۆر دەگرێت.**

**باج ئەم خەسڵەتانەی هەیە :-**

**بڕێکی نەختینەییە :-**

**باج بڕێکی داراییە بەشێوەیەکی نەختی دەوڵەت داوای دەکات لە تاکەکانی کەمەڵ ، کە بەشێك لەتوانای کڕینیان بدەن بە دەوڵەت لە پێناو بەکارهێنانی گشتی، بەپێچەوانە ئەوەی لە پێشووتر هەبوو کە باج بەشێوەیەکی نانەختینەیی بوو.**

**دەوڵەت پەیڕەوی باجی نەختینەیی کرد لەبەر ئەم لایەنە باشانەی خوارەوە :-**

1. **بوونی داد پەروەری دارایی ، چونکە باجدەر دەزانێ چەندی کەوتۆتە سەرشان.**
2. **دەستەبەرکردنی گوژمەیەکی نەختینەیی زۆر ، کۆکردنەوە وتێچوونی کەم.**
3. **ناتوانرێت فێڵ بکرێت لەداهاتی باجەکە[1].**

**بەلآم باجی نا نەختینەیی ئەم خراپیانەی هەی :-**

1. **زۆری تێچوونی گواستنەوە وعەمبارکردن ( ئاخنیین )**
2. **ترس لەدابەزینی بەهاکەی ئەمەش لەئە نجامی لەناوچوون ئاخود دابەزینی بەهاکەی.**
3. **دەتوانرێت بگۆڕدرێتەوە بەجۆری خراپ وفێڵ کردن لەنرخەکەی لەکاتی فرۆشتن.**
4. **گرانی چاودێری کردن وتێچوونی زۆر.**

[1] ئەیوب ئەنوەر سماقەیی , دارایی گشتی , چاپی حەوتەم , چاپخانەی شەهاب , هەولێر , 2014.

**سه پێنراوێکی ناچارییه:**

دەوڵەت بەسەپاندنی تێکڕای باج ونرخەکەی هەڵدەستێت و بڕی باجی هەموەکی ودیاری کردنی ئەو مادەیەی کەباجی لەسەر دادەنرێت ودیاری کردنی کاتی وەرگرتنی باج وچۆنێتی و وەرگرتن و کۆکردنەوەی باج دیاری دەکات. وەئەگەر هاتوو ئەو کەسەی کە باجی بەسەرا سەپێنراوە لاری هەبوو یاخود باجی نەدا ئەوا دەوڵەت پەنا بۆ هۆکاری سەپاندن دەبات کە ئەم سەپاندنەش بە یاسا دەرکێت.

**باج بەبێبەرانبەرە:**

کەسی ڕاسپاردراو بەدانی باج سودی ڕاستەوخۆ نابینێت بەرانبەر بە بڕی ئەو باجەی کەدەیتات بە دەوڵەت، واتا باج بەبێ بەرانبەرێکی ڕاستەخۆ خێرای ومەرجدارە، واتا ئەو کەسانەی باج دەدەن چاوەڕوانی هیچ خزمەتگوزاریەکی ڕاستەوخۆ لە دەوڵەت ناکەن بەمەش هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان ئەو باجەی کەتاکەکان دەیدەن لەگەڵ ئەو خزمەتگوزاری وسودانەی کەئێستاو ڕاستەوخۆ دەیبینن، بەلام تاك کە باج دەدات لەسەر بناغەی ئەو پەیوەندیەیە باجدەر وەك تاکێکی کۆمەڵ پەیوەندیەکی ڕامیاری ئابوری و کۆمەلایەتی هەیە بەدەوڵەت . لەڕاستیدا تاکەکانی کۆمەڵ لەماوەیەکی درێژدا سودمەند دەبن.

**باج بەشێوەیەکی کۆتاییە :**

باج بەشێوەیەکی کۆتایی دەدرێت لەژێر هەر بارودۆخێکدا بێت باجدەر بۆی نیە داوای گێڕانەوەی باجەکەی بکاتەوە تەنها ئەگەر باجدەر هەستی کرد زۆرداریشی تێدایەو لەبەرژەوەندی گشتیدا نیە ناتوانێت داوای بکاتەوە کەواتە باج بەشێوەیەکی کۆتایی دەدرێت و بێ گەڕانەوەیە.

**باج سەپێنراوێکی گشتیە :**

باج بەسەر هەموو کەسێکدا دەسەپێنرێت ، جا چکەسێکس سروشتی بێت یاخود مەعنەوی ئەمەش بەپێی توانا ئابووریەکەی نەك بەپێی هەرێمەکەی یاخود ولاچتەکەی یاخود ڕێچکە سیاسیەکەی ، واتا ئەو لایەنەی کەباج دەسەپێنێ دەبێت حکومەت بێت داهاتەکەی بچێتە گەنجینەی دەوڵەتەوە بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵدا, بەڵکو توانا ئابوریەکەی باجی بەسەر دەسەپێنرێت.

**نرخ وشێوەكانی باج:**

**نرخی باج یان تێكڕای باج** Tax Rate **بریتیە لەڕێچژەی باج بۆ ئەو مادەیەی كەباجەكەی لەسەر دانراوە (الواعاو) واتا ئەگەر باج (T) بڕدرا لەدەست هات (Y) كەواتا تێكڕای باجب دەست هات بریتیە لە** Y/T.

**باجی پێوانەیی** Index Tax:

**بە پێی ئەم ڕێگایە لە پێشدا نرخ دیاری دەكرێت، بەڵام داهاتی باج نازانرێت، تەنها پاش كۆكردنەوە نەبێت جۆرێك لەنەرمی تێدایە كە دەوڵەت دەتوانێت كەم و زیادی بكات لەكاتی گۆڕانی بارودۆخی ئابوری وكۆمەڵایەتی بەڵكو زیاتر دادپەروەری تێدا هەیە. دەكرێت نرخ دیاری كردنەكە بەشێوەیەكی جێگیر بێت یان هەڵكشان وداكشانی تێدابێت.بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**باجی ڕێژەیی (تێكڕای جێگیر) :** Proportional Tax

**بریتیە لەو باجەی كە نرخەكەی جێگیرە هەرچەندە ئەگەر ئەو مادەیی باجەكەی لەسەر دانراوە گۆڕوبێت، بەواتایەكی تر نرخەكەی بەڕێژەیەكی جێگیرە بەرانبەر ئەو مادەیەی كە باجەكەی لەسەر دانراوە بەبێ گوێدانە بەهای ئەو مادەیەی باجی لەسەر دانراوە**[1].

**باجی هەڵكشاو:** Progressive Tax

**ئەو باجەیە كە نرخەكەی دەگۆڕێت ئەمەش بە گۆڕانی بەهای مادەكەی كە باجی لەسەر دانراه واتا نرخ زیاد دەبێت بەزیاد بوونی مادەكەی نرخی باجی هەڵكشاو دەگۆڕێت بەگۆڕانی بەهای مادەكەی هەموو كات بەهای باج بەڕێژەیەكی زیاتر زیاد دەبێت لەچاو زیادبوونی بەهای مادەكە.**

**باجی ڕاستەوخۆ و باجی ناڕاستە وخۆ:** Direct Tax and Indirect Tax

**گرنگترین پۆلێن كردن بەدارایی گشتی ، پۆلێنكردنی باجە بۆ باجی ڕاستەوخۆ و باجی ناڕاستەوخۆ لەبەر ئەوەی كاریگەری لەسەر دادپەروەری باج و دابەشكردنی بارگرانی باجە و دابەشكردنی دەسهات هەیە چونكە باج لە دەسهات و سەرمایە دەبڕدرێت جا چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ.**

[1] **ئەژاد عبدالقادر شمقار , فەرهەنگی ئابووری , دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم , سلێمانی ,** 2002.

**باجی ڕاستەوخۆ:** Direct Tax

**باجی ڕاستەوخۆ بریتیە لە لێبڕینێکی ڕاستەوخۆ لەدەسهات یان سەرمایە کە ڕاستەوخۆ دەسە پێنرێت بەسەر خودی سامانەکە.**

**دەسە پێنرێتە سەر بوونی دارایی بوونی سامان یان هەبوونی دەسەلأت جا ئەم دەسهات وسەرمایە بەکاربهێنرێت یاخود بەکار نەهێنرێت.**

**جۆرەکانی باجی ڕاستەوخۆ**

**دەتوانرێت جیاوازی لەنێوان دوو کۆمەڵی باجی ڕاستەوخۆ بکەین:**

**یەکەم/ باجی ڕاستەوخۆی دەسهات:** Direct Income Tax

**ئەم جۆرە بەسەر هەر مادەیەك لەکاتی بەدەستهێنانی یان لەکاتی چوونە ئەستۆی ڕوولێنراو دەسە پێنرێت لەگەڵ ئەوەی بەکارهێنانی ئەم جۆرە باجە تازەیە بەلأم لەڕۆژگاری ئەمرۆ بەگرنگترین سەرچاوەی داهاتی دادەنرێت لەولأتی پێکەوتوو ئەگەر ڕوولێنراو بۆ دانی باج تاکێك یان کەسێکی سروشتی بێت ئەوە باجەکە دەسە پێنرێت بەسەر دەسهاتی کەسەکە (** Personal Income Tax **) بەلأم ڕوولێنراو کەسایەتیەکی ناسروشتی بوو لەسەر شێوەی پرۆژەی بەشداریکەر بوو بەم باجە دەگوترێت باجی سە پێنراو بەسەر دەسهاتی پرۆژەکان (** Income Portion Tax **) لێرەدا پێویستە مانای دەسهات (** Income **) بەوردی دیاری بکەین بۆ ئەوەی بزانین چ شتێکی دەسهات باجی لەسەر دادەنرێت وەدەرباز نەبوونی و هەڵنەهاتنی هەندێك لە پێکهاتەکانی لەکاتی سە پاندنی باجدا.**

**باجی ناڕاستەوخۆ** ( Indirect Tax )

بریتیە لەو باجەی ناڕاستەوخۆ لە دەسهاتو سەرمایە دەبڕدرێت و دەسە پێنرێت لەسەر بەکارهێنانی سامان گرنگترین جۆرەکانی بریتین لە باجی بەرهەم و باجی خەرج کردن باجی بەکارهێنان باجی دەستاودەست کردن باجی گومرکی ، ئەم جۆرە باجە دەسە پیچنرێت بەسەر بەکارهێنانی سامان نەك بوونی سامان کە ئەگەر هاتوو خاوەنەکەی بەکاری هێنا ئەوا باجی دەخرێتە سەر ، ئەم جۆرە باجە ڕێچکەی سامان دەگرێت و لە گواستنەوە و قۆناغەکانی بەکارهێنانی.

**جۆرەکانی باجی ناڕاستەوخۆ**

**یەکەم: باجی خەرجی** ( Expenditure Tax )

ئەو باجەیە دەسە پێنرێت لەسەر بەکارهێنانی دەسهات و سامان بەبۆنەی خەرجکردنیان یان بریتین لەسە پاندنی باج بەسەر باجدەرەکانی بەکارهێنانی کالاً و خزمەتگوزاری ، وە پێشی دەگوترێت باجی بەکارهێنان ( Consumption Taxes ) یان باجی بەکارهێنان زۆر ناویتر لەخۆدەگرێت بە پێی ئەو قۆناغەی کە باجەکی بەسەردا دەسە پێنرێت ، ئەگەر لە قۆناغی بەرهەمهێنان بوو پێی دەگوترێ باجی بەرهەم ( Excise Tax ) ئەگەر لەکاتی فرۆشتن بوو پێی دەگوترێت باجی فرۆشتن ( Sale Tax ) یان باجی فرۆشتەنی ( Purchase Tax ) باجی خەرجی زۆر شێوەیان هەیە گرنگترینیان وەك[1]:

**باجی گومرکی** ( Custom Tax )

باجی گومرکی لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە لەکاتی پێشکەوتنی شار ودەرکەوتنی سیستەمی ڕێکخستنی کۆمەلآیەتی کە خۆیی لە دەوڵەت و دروستیبونی بازرگانی لە نێوان گەلآن دەبینێتەوە. ئەم جۆرە دەتوانین لەزۆر ڕووەوە سەیری بکەین، وەك:لەڕووی ئەو مادەیەی کە باجەکەی لەسەر دەس*ە پێنرێت.

باجی هاوردە ( Imports Tax ) : دەسە پێنرێت بەسەر شتومەکی بیانی هاوردە ئەو کالآیانەی کەلەناوچەی ئازاد ڕادەکێشرێت بۆ بەکارهێنانی ناوخۆیی ، واتا ئەو مادەیەی کەباجی لەسەر دادەنرێ دەبێت هاتبێتە ناو سنوری وڵات کە سنورێکی جیایە بە پێی پەیمان نامە نێو دەوڵەتیەکان ، ئەم جۆرە بەگرنگترین جۆری باجی گومرکی دادەنرێت و زۆریش بلآوە لەبەر ئەو سودانەی کە بە ئابووری نەتەوایەتی دەگەیەنێت

---

[1] فیصل دباغ , ئینسکۆپیدیای ئابووری , دەزگای موکریانی , هەولێر , 2004.

**سوودەکانی باجی هاوردە:**

- داهاتێکی زۆر دەدات.
- هانی پەرەپێدانی ئابوری نەتەوەیی دەدات و یارمەتی کەرتە ئابوریەکان دەدات و پیشەسازی ناوخۆیی دەپارێزی لە کێبڕکێی بیانی بە تایبەتی پیشەسازیە نوێیەکان.
- داهاتەکەی بەکار دەهێنرێت بۆ چارەسەر کردنی تەرازوی پێدان لەکاتی ناهاوسەنگی.
- هانی کەمکردنەوەی بەکارهێنان و زیادبوونی پاشەکەوتو هانی وەبەرهێنان دەدات.
- ڕادەی بێکاری کەم دەکاتەوە.
- دووبارە داشبەشکردنەوەی لەبوارەکانی بەرهەمهێنان.
- بەرزکردنەوەی ئاستی تەندروستی و پاراستنی ئاکار ورەوشتی کۆمەڵگا.
- بەهێزکردنی ئاسایشی نەتەوەیی

**کاریگەری باج لەسەر بەکارهێنان وپاشەکەوت** ( Consumption – Saving )

ئاشکرایە کەسەرچاوەی بەکارهێنان و پاشەکەوت دەسهاتە ، لەبەر ئەوەی باج بریتیە لەلێبڕینێك لە دەسهاتی تاکە کەسی ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەی پێکهاتەکانی دەسهات ، کەبریتین لەبەکارهینان و پاشەکەوت هێزو بڕی کارتێکردنی باج دەگۆڕێت لەسەر بەکارهێنان وپاشەکەوت، بەپێی ئەو چینەی کە باجی لەسەر دەسەپێنرێت، هەروەها دەوەستێتە سەر جۆری باجەکە و پلەی نەرمی نواندنی خستنە ڕووی خواستی کاڵاکە. ئەگەر هاتوو باج بەسەر چینی دەوڵەمەن سەپێنرا ئەوا دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی پاشەکەوت بە بەراورد بە بەکارهێنیان ، واتا واز لە بەشێك پاشەکەوت دەهێنێت لە پێناو بەکارهێنان لەبەر ئەوەی ئارەزووی ڕادەداریان بۆ بەکارهێنان کەمەو ئارەزووی ڕادەداریان بۆ پاشەکەوت زۆرە.

**کاریگەری باج لەسەر ئارامی باری ئابوری:**

باج وەك هۆکارێك دادەنرێت بۆ ڕاگرتنی باری ئارامی ئابووری چ بۆ چارەسەر کردنی بێ بازاڕی یان کاتی هەڵئاوسان ، ناتوانرێت بەتەنها کاریگەری باج باس بکەن چونکە کاریگەری باج و کاریگەری خەرجی بەیەکەوە دەردەکەوێت، چونکە بەیەکەوە بەکاردەهێنرێن لە چوارچێوەی سیاسەتی دارایی بەهەر دوو باڵی خەرجی و باجی.

**سەرچاوە**

1. **ئەیوب ئەنوەر سماقەیی , دارایی گشتی , چاپی حەوتەم , چاپخانەی شەهاب , هەولێر** ,2014.
2. **نەژاد عبدالقادر شمقار , فەرهەنگی ئابووری , دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم , سلێمانی** , 2002.
3. **فیصل دباغ , ئینسکۆپیدیای ئابووری , دەزگای موکریانی , هەولێر** , 2004.